

نەسیم
کۆمەڵە چیرۆکێکی ئاژەڵان لەقورئاندا
دەزگای بوراق
بۆ رۆشنبیری منداڵان
www.alburagh.com
شەمیم سنە
١٠
قەلی زیرەک
و
چیرۆکی کوڕەکانی ئادەم قابیل و هابیل
ناوی کتێب: قەلی زیرەک
ئامادەکردنی: واریس ئەلکندی
وەرگێڕانی: نەریان ئەحمەد زەردەشت
هەڵەچن: ڕەووف مەلایی
بڵاوکراوی: بوراق بۆ چاپ وبڵاوکردنەوە
بڵاوگەی هاوکار: شەمیم سنە
دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور
نیگار: تەیبە عەبدوڵڵا
ڕەنگی ژمارەی: سۆلاف عەباس
سەرپەرشتی هونەریی: محەمەد ئەلقاسمی
چاپی یەکەم ٢٠١١ تیراژ: ٥٠٠٠ دانە
ISBN: ٩٧٨-٩٦٤-١٩٢-٣٦١-٩
مافی لەچاپدانەوە پارێزراوە
ژمارەی سپاردن بەدەزگای کتێب وبەڵگەنامەکان- بەغدا (١٤٠٤) ساڵی ٢٠٠٩

هاوڕێیان سڵاو

قەل .... باڵندەیەکی ژیر و زیرەکە، هەر لە بوونی بوونەوەرانەوە، یەزدان خوڵقاندۆتی، لە پاش ئەوەی باوکە ئادەم و دایکە حەوامان لە بەهەشتەوە بەرەو زەوی نێردران و ژیانی مرۆڤ بە سەر ئەم ئەستێرە حەوانە مانەوە دەستی پێکرد، ئەڵبەتە یەکەم پێغەمبەری یەزدان بە سەر زەمینەوە ئادەم (س.خ) بوو لەگەڵ دایکە حواماندا، زەمینیان ئاوەدان کردەوە و ژیانیان تەشەنە پێ کردوە دەستیان کردە کێڵان و چاندنی زەوی و بنیاتنانی خانووماڵی کردنی مەڕوماڵات و هەڵکەندنی جۆگە لە ڕووبار بۆ ئاودێری. یەزدانی گەورە، نێردراوی خۆی بەسەر زەمینەوە فێرکرد کە چۆن زەوی بچێنێت و کار و گوزەران بکات.

دایکە حەوامان قابیل و هابیلی دەبێ، ئادەم زۆر بە لە دایکبوونی ئەو دووانە دڵشاد دەبێ لە ژێر چاودێری دایک و باوکدا پەروەردە و گەورە بوون. بە لاوی کە یارمەتی دایک و باوکیان دەدا لە کێڵان و چاندن و پەروەردە کردنی ئاژەڵ و ڕستنی خوری بۆ دابێن کردنی جل و بەرگ و ڕاخەر، هەر وەها کۆکردنەوەی دار بۆ خۆگەرم کردنەوە و خۆراک و ئامادەکردنی پێداویستیەکانیتری ژیانی ئەو سەردەمە.





هەر لە منداڵییەوە هابیل کاری زیاتر و بە دڵسوزتر دەکرد و گوێڕایەڵی دایک و باوکی بوو، بە پێچەوانەی قابیلەوە کە هەمیشە حەزی لە بێکاری و پاڵدانەوە و تەمەڵی دەکرد، بێ باک بوو لە ئاست کارەکانیدا و زۆر جار لە فەرمانی دایک و باوکی دەردەچوو، هەر وەک خاوەن باوەڕێکی ئەوتۆ نەبوو، جگە لەوەی خۆپەرست و لە خۆبایی بوو، بە دەگمەن پێدەکەنی و هەمیشە دەموچاوی تێکترشا بوو.



باوکە ئادەم و دایکە حەوامان هەمیشە ئامۆژگارییان دەکرد و هابیلیان وەک نموونە بۆ باس دەکرد، کە چۆن گوێڕایەڵە و هەمیشە دڵسۆز و بە ڕاستی کاری خۆی دەکات، لەبەڕی ئەوەی قابیل ئامۆژگارییەکانی باوک و دایکی بە گوێدا چێت، بە پێچەوانەوە ئیرەیی هابیلی برای دەکرد و ڕک وکینی لێ بوو، بە تایبەتی کاتێک کە دایک و باوکی لە خۆیان نزیک دەکردەوە، بەم جۆرە قابیل گاڵتەی بە هەموو کاروکردارێکی هابیل دەکرد و بە هەڵە لە قەڵەمی دەدان، بەڵام هابیل تەنها بزەیەک دەیگرت.



ئەڵبەتە لە بەر ئەوەی هابیل باوەڕی بە یەزدانی مەزن پتەو بوو، دەیزانی کە براکەی بە هەڵەدا چووە و ئیرەیـی پـێ دەبات و دەیەوێ بە بێ ئەوەی شـتێک بکات دایک و باوکی ستایشـی بکەن و لە خۆیان نزیک بکەنەوە، هابیل چەندین جار قسـەی لەگەڵدا کرد و ئامۆژگاری دەکرد، کە پێویسـتە ئەرکەکانی سەرشـانی خـۆی بەجێ بێنێ و تەنانەت ئەرکە ئاینیەکانی و بە قسـەی دایـک و باوکی بکات و لە کاردا یارمەتییـان بـدات و ئـەوەی دەخسـتە مێشـکەوە کە خۆشـی دەوێت و ڕێزی لێ دەنـێ و ئازیزییەتی، بەڵام ئیرەیی دڵـی ڕەش کردبوو، هەر بۆیە هیچ ئامۆژگارییەکی بە مێشکدا نەدەچوو.

ڕۆژێکیان قابیل و هابیل ناکۆکی کەوتە بەینیان، قابیل دەست درێژی کردە سەر براکەی وەک هەموو جارێک، ئەم ناکۆکییە لە نێوانیاندا گەورە بوو و تەشەنەی کرد، هەر چەندە هابیل ویستی لە قابیلی برای نزیک بێتەوە و بیدوێنێ و کۆتایی بەو ناکۆکییە بێنێ قابیل دڵی نەرم نەدەبوو، دایکە پڕسۆزەکەیان کەوتە نێوانەوە و ویستی ئەو بارەی نێوانیان چاک کات، نەیتوانی چونکە بە پێچەوانەی هابیلەوە قابیل پڕ کین ودڵڕەق بوو.



ئینجـا باوکــه میهرەبانەکەیان کەوتە نێوانەوە، تا ئەو ناکۆکییە لە نێوان هەردو براکەدا کۆتایی پێ بێنێ، لەکۆتاییدا ئادەم (س.خ) بە قابیلی کوڕی وت: تۆ بەهەڵەدا چوویت و چەواشەیت و هابیل خاوەن دادو ڕاسـتە و تۆ دەسـت درێژیت کردووە، قابیل وتی نەخێر هەڵەکە لەوەوەیە، من لەسـەر ڕێگای ڕاستم، ئـادەم (س.خ) وتی باشـە ئەم کارەتان بەرەو دادوەری یەزدان بکەنـەوە، تا ئەو دادپەروەریتان بکات، ئەوسـا دەزانین کامتان دەسـت درێژیتان کردۆتە سەر ئەوی‌ترتان، چونکە یەزدانی مەزن دادوەرێکی ڕاسـت و ڕەوانە، هەر دوو براکە وتیان دەباشـە ئێمە ڕازین بە حوکمی یەزدان چـی بکەیـن؟ باوکـە وتی با هـەر یەک لە ئێـوە قوربانییەک بـۆ یەزدان پێشکەش بکات ئەوەی یەزدان قوربانییەکەی قبووڵ بکات ئەوا خاوەن حەقە و بە پیچەوانەوە ئەوا ڕەوا نییە، هەردووکیان ڕازی بوون.




هابیـل باشـترین و قەڵەوتریـن مەڕی لە ڕانەکـەی هەڵبژارد تا بیکاتە قوربانی بۆ یـەزدان و داوای لە یەزدان کرد کە پەردەی ڕوونی بەسەر ڕاستییەوە هەڵماڵێ، لە کاتێکدا قابیلی ڕژد هەندێک گژوگیای کۆکـردەوە و کـردی بـە قوربانی و دڵی نەهات یەکـێ لە مەڕەکانی هەڵبژێرێ.



براكان سەیری قوربانیەكانیان دەكرد، یەزدانی مەزن قوربانییەكەی هابیلی قبوولْ كرد و بەرەو ئاسمانی بەرز و بەرینی كردەوە. لە كاتێكدا قوربانییەكەی قابیل بەسەر زەوییەوە مایەوە، هابیل سوپاسی یەزدانی كرد و باوك و دایكی دڵنیا بوون لەوەی بێ خەتایە، بەم جۆرە ڕك و كینی قابیل زیاتر بوو، بیری لەوە كردەوە كە هابیل بكوژێ و هەڕەشەی كوشتنی لە براكەی كرد، هابیل وتی: ئەگەر تۆ بە مەبەستی كوشتنەوە دەستم لێ بەرز دەكەیتەوە، من وەك تۆ ناكەم، چونكە من لە یەزدانی مەزن دەترسم.

ڕۆژێکیان هابیل سـەرقاڵی کارەکەی دەبێ، قابیل بەردێکی پیا دەماڵێ و دەیکوژێ، قابیل ترسـا و واقی وڕما و نەیدەزانی چۆن بیشارێتەوە، یەزدانی مەزن قەلێکی بۆ نارد لە تەنیشت تەرمی ستەم لێکراوەوە نیشـتەوە کـە قەلێکی مـردارەو بووی لێ بوو، قەلەکە بـە دەنووک زەوییەکـەی هەڵکەند و بە چنگی خۆڵەکەی لابرد و چاڵێکی دروسـت کرد. قەلە مردارەو بوەکەی هەڵگرت و ناشـتی و خۆڵی بەسـەردا کـرد... بەم جـۆرە قابیل فێر بـوو چۆن براکەی بشـارێتەوە، چاڵێکی هەڵکەنـد بـە پەشـیمانییەوە براکەی ناشت و خۆڵی بەسـەردا کـرد، بـەم جـۆرە قەلە زیرەکەکە پشـت بەفەرمانـی یەزدان ئـەوەی فێری مـرۆڤ کـرد کە چۆن مردوو بنێژێ...






## ئەم ئایەتانەی پیرۆزی قورئان سەبارەت بە چیرۆکی قەلەکەیە لەگەڵ "قابیل و هابیلی کوڕانی ئادەم (س.خ)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

سەرئەنجام نەفسی سەرکەشی هانیدا و کوشتنی براکەی لا سادە و ئاسان کرد و کوشتی، ئیتر خۆی خستە ڕیزی خەسارەتمەند و زەرەزمەندانەوە.

(لەوەدوا گیری خوارد بە دەست تەرمەکەیەوە، چونکە وادیارە یەکەم کەس کوژرا بێت و شەهید بوو بێت)، ئەوسا خوای میهرەبان قەلە ڕەشێکی نارد و چاڵێکی لە زەویدا هەڵکەند (بۆ قەلە ڕەشێکی‌تری مردارەوە بوو) تا نیشانی بدات چۆن لاشەی براکەی بشارێتەوە، (هەر کە ئەوەی دی) وتی: هاوار لە من، ئایا ئەوە من نەمتوانی وەکوو ئەو قەلەڕەشە بکەم و بەقەدەر ئەوەم لێ نەهات تا لاشە و عەیب و عاری براکەم بشارمەوە، ئیتر بۆ هەمیشە چووە ڕیزی پەشیمانانەوە.

سورة المائدة /الآيتان ٣٠-٣١

